زنجیرەی گەنجانی ئیسلام _4_

# پێشەوا ئیبن تەیمیە

## پارێزەری سوننەت و شێری جیهاد

نووسین و ئامادەکردنی : باوکی خەباب



# پێشەوا ئیبن تیمیە

## پارێزەری سوننەت و شێری جیهاد

نووسین و ئامادەکردنی: باوکی خەباب

KTIBXANY_TWESHU

# پێشەکی

الحمد لله، أعظَمَ للمتقين العاملين أجورَهم، وشرح بالهدى والخيراتِ صدورَهم، أشهد أن لا إله إلا الله وحدَه لا شريكَ له، وفّق عبادَه للطاعات وأعان، وأشهد أنّ نبيَّنا محمّدًا عبدُ الله ورسوله خير من علَّمَ أحكامَ الدِّين وأبان، صلّى الله عليه وعلى آله وأصحابِه أهلِ الهدى والإيمان، وعلى التابعين لهم بإيمان وإحسان ما تعاقب الزمان، وسلّم تسليمًا مزيدا.

لە زانایانی (متأخرين) دا، شارەزا نیم هیچ کەسێك ئەوەندەی (ابن تيمية) خزمەتی بە دینی ئیسلام کردبێت، ئەگەرچی یەك زانا بووە، بەڵام ئەوەندەی سەد زانای بەتوانا و دڵسۆز بەرهەمی جۆراوجۆری لە بوارەکانی زانستدا پێشکەش کردووە، نووسینی کتێب و بەرپەرچدانەوەی تاقمە گومڕاکان و وەڵامدانەوەی فەلاسیفە و ئەهلی کەلام و بەرگریکردن لە عەقیدەی ئیسلامی و جیهادی تەتار و لە چەندین بوار و تەوەری گرنگی تر لە ژیانیدا حزمەتی کردووە.

ژیانی بە تەواوی پێشکەشی دینەکەی کردبوو، ژیانێکی پڕ لە بەرەکەت، کەمترین ساتی بە زایە نەدا و سەرجەمی تەمەنە پڕ لە پیتەکەی بۆ خزمەتی دڵسۆزانەی دینەکەی کرد بە قوربانی، تەنانەت بواری نەبوو هاوسەرگیریش بکات و بە ماڵ منداڵەوە سەرقاڵ بێت،

بەڵام لە جیاتی مناڵێك و دووان كە ناوی هەڵگرن و یادی بهێڵنەوە، ملیۆنەها موسوڵمان لە سەرتاسەری زەوی و هەموو سەدەكاندا شانازی بە ئیبن تیمیە دەكەن و دوعای بۆ دەكەن و پێی سەرسامن و كتێبەكانی دەخوێننەوەو شەرحی دەكەن و وەریدەگێڕن...

دیارە حیكمەتی ئەوە بووە كە اللـه تعالی ئەو كەڵە پیاوەی بۆ ڕێپیشاندانی ئومەتێك درووستكردووە والله أعلم .

ئیبن تیمیە لەو ڕۆژەوەی كە لە دونیا دەرچوو ڕۆڵی ڕاستەقینەی دەستی پێكرد و مەودای كاریگەری و ڕوناكی زانستەكەی بەرینتر بوویەوە و تا دێتیش فراوانتر دەبێت، سەیریش ئەوەیە سەرەڕای تێپەڕبوونی حەوت سەدە لە وەفاتی ئەم زانایە، هێشتا بەناوی، بە كتێبەكانی، بە نامە و نامیلكەكانی، بە قسە ڕوون و ئاسان و جوانەكانی، بە هەڵوێستە حەقەكانی، بە بەرجستەكردنەكانی بۆ قورئان و سوننەت لە نووسینەكانیدا، چەنێك موسوڵمانانی سەرسام كردووە و پێوەی وابەستەبوون، دە ئەوەندە ستەمكاران و گومڕاكان و دوژمنانی ئیسلامی تۆقاندووە و ئاسوودەیی لێ تێكداون.

بۆیە دەبینین جیاواز لە زۆربەی زانایانی تر، ڕۆڵی ئیبن تیمیە لە ئاستێكی دیاریكراودا ڕاوەستاو و جێگیر نییە، بەڵكو لەبرەودایە وەكو ئەوەی لە ژیاندا بێت و چالاكییەكانی زۆر لە چالاكییەكانی سەدەی هەشتەمی كۆچی زۆرتر و فراوانتر بووەتەوە، ساڵ بەساڵ و سەدە بەسەدە

کاریگەری ئەو زانا گەورەیە زیاد دەکات و کەسایەتی کاریگەرتر دەبێت.

هەر کتێبێکی دەڵێی زانایەکی سەرکردەیە و بەرگری لە ئیسلام دەکات، (مجموع الفتاوی) کەی هاوشێوەی سوپایەکی مەشق پێکراوە و لە بۆسەدایە بۆ هەر کەسێك پیلان بۆ ئەم دینە بگێڕێت و بەرانبەر شوێنکەوتوانی نیازی خراپ بێت بۆ ئەوەی تۆڵەی لێ بکاتەوە.

ئیبن تیمیە بۆ خۆی قوتابخانەیەك بوو، مەشخەڵێك بوو، بەمردنیشی نەك هەر نەکوژایەوە، بەڵکو ڕۆشنایەکەی پتر بوو و زیاتر درەوشایەوە.

ئیبن تیمیە خاوەن ڕەوشت و ئاکارێکی زۆر بەرز و جوان بووە کە تەنانەت نەیارەکانیشی پێ سەرسام بووە، هەرگیز دوعای لە نەیارەکانی نەدەکرد، (ابن القیم) جارێکیان بە خۆشحاڵییەوە هەواڵی مردنی یەکێك لە نەیارە سەرسەختەکانی پێدا کە زۆر ئازاری دابوو، بەڵام ئیبن تیمیە ڕووی خۆی لێ گرژ کرد و هەواڵەکەی پی ناخۆش بوو و، وتی: (إنا لله وإنا إليه راجعون)، ئینجا ڕۆیشت بۆ ماڵی ئەو نەیارەی و وتی هەرچی پێویستییەکتان هەبوو من بۆتانی ئەنجام ئەدەم ولەمەولا من لە جێگای باوکتانم! ئەوەش لە کەڵە پیاوێکی وەکو ئبن تیمیە سەیر نییە کە بە جوانی لە جەوهەری ئیسلام تێگەیشتبوو.

ئیـبن تیمیـه حـاڵەتیكی دەگـمەنە لە مێـژووی ئیسـلامدا، چـونكە ئەگەر زۆرێك لە زانایان لەیەك بواردا پسـپۆڕ بـوونە و كاریگەرییـان هەبـووە، ئەوا (ابـن تیمیـة) كەسـێكی مەوسـوعی بـووە و لە زۆربەی بوارەكـانی زانستدا لێهاتوو و پێشەنگ بووە، لە عەقیدە و لە فەرموودە و ئوسـوڵ و تەفســیر و بەرپەرچــدانەوەی تاقمەگومڕاكــان و فەلاســیفەدا كتێبــی نووسیوە ودانراوی بە پیزی بۆ جێهێشتووین.

بەڵام سەرەڕای زانستی زۆری و ئاكـاری بەرزی، دواجـار (ابـن تیمیـة) مرۆڤ بووە، بـۆیە نامەوێـت كەس وا تێبگـات كە مـن ویسـتوومە بڵـێم هەڵەی نەبووە، بەڵێ نە پێكان و هەڵەشـی بـووە، چـونكە ئەوە سروشـتی ئادەمیزادكانە.

## زیرەکی و بلیمەتی ئیبن تیمیە

ئیبن تەیمیە خوای لێی ڕازیبێت هەموو تەمەنی تەرخانکردبوو بۆ خوای گەورە و، بەدەیان بەرگیش پەرتوکی لە بوارە جۆراو جۆرەکاندا داناوە بە ئومێدی سەرخستنی قورئان¬و سوننەت¬و بەرچاوڕونی موسوڵمانان، وەبە جیهادیش هەوڵیداوە سەریانبخات وە بەزمان¬و بە بەڵگەش هەوڵی دیار و بەرچاوو کاریگەری گێڕاوە، چونکە خوای گەورە ویست و ئیرادەی وابووە کەبیکات بەقەڵایەك تاهاتنی قیامەت.

(حافظ ابن عبدالهادی ) لە ( عقود الدریە مناقب شیخ الإسلام ابن تیمیە) دا باسیدەکات و دەربارەی دەفەرموێت: ( خەڵکی دیمەشق سەریان سوڕمابوو لە بلیمەتی و زیرەکی بیرتیژی توانای لە بەرکردن و دەرککردنی بەمەسەلەکان، ژمارەیەك لە زانایان هاتنە سەردانی شاری حەلەب و پێیان وتم بیستومانە منداڵێك هەیە ناوی ( ئەحمەدی کوڕی تەیمیەیە) زۆر بەتوانایە لە (حفظ )¬و زۆر مەبەستمانە بیبینین، وتیان ئەوەتا لەو قوتابخانەی لە بەرکردنی قورئان دەخوێنێت وەپاشان وتیان ئەو منداڵە یەك پارچە لەوحەکەی بەدەستەوەیە (لەوحی نوسین)، ئەو زانا بەڕێزانە بانگیانکرد و لەوحەکەیان لێوەرگرت و دایانەوە و وتیان کوڕەکەم ئەو نوسینانە بسرەوە تا شتێکت پێبڵێین بینوسیت، ئەویش

سرِیەوە پاشان یازدە یان سێزدە مەتنی فەرموودەیان پێوت، ئەویش دەینووسی و یەك جار تەماشایدەکرد و لەوحەکەی دایەوە دەستیان کەلێی بپرسنەوە، بینیان زۆر بە چاکی و بە لەبەرکراوی دووبارەیان دەکاتەوە!

پاشان وتیان ئەوانە بسرەوە، دواتر چەندین سەنەدی فەرموودەیان پێوت ئەویش نووسی و بەیەکجار سەرنجدان ئەمانیشی بە لەبەرکراوی بۆ وتنەوە، ئا لێرەدا یەکێك لەو زانایانە وتی: ئەم منداڵە گەر بمێنێت ئەوا دەورێکی زۆر گەورەو کاریگەر دەگێرێت لە داهاتوودا وەوتیان هاوشێوەی ئەمە نەبینراوە!

ویستی خوای گەورە وابوو ئەم منداڵە گەورەبوو، (حافظ الذهبي) خوای لێی رازیبێت لەبارەیەوە لە(معجم الشیوخ)دا فەرموویەتی: لەو چەرخەدا بێهاوتا بوو لە زانست و زانیاری و زیرەکی و سەخاوەت و نەسیحەت و فەرمانکردن بەچاکە و نەهیکردن لەخراپە..

پاشان دەربارەی دەفەرموێت: سوننەتی بە بەهێزترین بەڵگە سەر دەخست لە پێناوی خوای گەورەدا لەلایەن نەیارانیەوە ئازاری زۆری چەشت، لەپێناوی سەرخستنی سوننەتدا زۆر هەوڵیاندا بیتۆقێنن بەڵام خوا ئەمی سەرخست دڵی خواترسانی بۆ واڵاکرد و خۆشەویستی چووە دڵیانەوە و ناحەزانیشی دەمکوت بوون¬و، خوای گەورە ئەمیکردە سەبەب کەخەڵکانێکی هیدایەتدا لەسەر دەستی، وە دڵی چەندین پاشا و

ئەمیری وابەستەکرد کەگوێڕایەڵی نەسیحەتەکانی بن، خوای گەورە شـام و بـــەڵکو هـــەموو ئیسلامیشـــی لەسەردەســـتی ژیانـــدەوە، ئەوکاتـــەی کەتەتەرەکان هەوڵیاندا خـاکی موسـڵمانان بخەنـە ژێـر ڕکێـف و جـەورو ستەمیانەوە، ئەمە ئەوکاتە بوو کەترس کاری لەناخی موسڵمانان کردبوو، دووروِان دەوری چەپەڵیان دەگێڕا و بڕواداران بێ پێشەوا مابونەوە .

پاشان دەفەرمووێت: سوێند دەخۆم کە هەرگیز لە نموونەی ئەوم نـەبینیوە وە خۆشی لەوێنەی خۆی چاو پێ نەکەوتووە!

## داستانەکانی ئەم شێرە...

ئیبن تەیمیە ئازا و بوێر و خۆڕاگر بوو، (حافظ البزاز) ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت لەم بارەوە فەرموویەتی: ئیبن تەیمیە ئازاترین کەسێك بوو، کە بەهێزترین و سەقامگیرترین دڵی هەبوو، کەسم نەبینیوە لەو خۆڕاگرتر، لەو زیاتر بەرگەی نارەحەتی جیهاد بگرێت لەپێناوی خوای گەورەدا، بەدڵی بەزمانی بەدەستی جیهادی دەکرد لەپێناوی خوادا و لە لۆمەی لۆمەکاران سڵی نەدەکردەوە.

وە چەندین کەس گێڕاویانەتەوە کە ئیبن تەیمیە لە هەر سوپایەکی موسڵمانانندا بوایە هۆکاری دڵ ئارامی ئەو موجاهیدانە بوە، وە هەر کەسێکی ببینیایە ترس و خۆف و کەم غیرەتی دووچار هاتبێت ئەوا نەسیحەتی دەکرد و ورەی بەرزدەکردەوە و مژدەی سەرکەوتنی دەدایە و فەزڵی جیهاد و موجاهیدانی بۆ ڕووندەکردەوە .

زانای گەورەی ئیسلام ئیبن تەیمیە ئەمە و زۆر لەمەش زیاتربوو لە گۆڕەپانی جەنگدا بەوێنەی شێر دەهات و دەچوو، ( حافظ البزاز ) لەم بارەوە فەرموویەتی: لە جیهاددا کاتێك سواری ئەسپەکەی دەبوو بەبێ سڵەمینەوە بەوێنەی ئازاترین سوارچاك بە دەنگێکی دوژمن تۆقێن بە ناو

ڕیزەکـــانی دوژمنـــدا هـــاواری ئـــەکرد (اللـــه اکـــبر) وەبـــە شـــێوەیەك کوشتاریدەکرد کە دەی سەلماند ئەم هەرگیز لە مردن ناسڵەمێتەوە،
شایانی باسە کەهەرئازایەتی و سەرنج و تێبینـی ڕاسـت و دروسـتیەکەی ئەوبوو کەبووە سەبەب بۆ فەتحی عەکا و ڕزگارکردنی، هـەروەك (حـافظ البزاز ) باسی لێوەکردووە.
ئیبن تەیمیە تەنها لەم بوارەدا ئەسپی خۆی تاو نەداوە، بەڵکو خۆی لەزۆر مەسەلەی ترداوە کەزانایانی پایە بەرز لەئاسـتیدا هـەڵوێسـتەیـانکردووە، (حـافظ البـزاز) دەفـەرمووێت: ئەگـەر کەسـێك بـە چـاوی عەدالەتـەوە بروانێتە ئیبن تەیمیە ئەوا دەبینێت کە ئیبن تەیمیـە زۆر پابەنـد بـووە بـە قورئان و سوننەتەوە و بۆ قسەی هیچ کەسێك ئامادە نەبوە لێی لابدات بـا ئەو کەسە پاشا و ئەمیر و دەسەڵاتدار بوبێت، یا زاڵم وزۆردار و شمشـێر وەشێن و قامچی وەشێن بوبێت،
کە ویسـتبێتیان لـە هـەڵوێسـتەکانی پاشـگەزی بکەنـەوە، ئـەو دەسـتی گرتبوو بە (العروة الوثقی)وە وەلەسـەردەمیدا بـەوە نـاسرابوو کـە کـەس هێندەی ئەم شوێن پێی قورئان سـوننەتی هـەڵنـەگرتوە و پێـوەیـان پابەنـد نەبوە!.

## ئیبن تەیمیە و سەرخستنی سوننەت...!

لە فەرموودەیەکی صەحیحی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ هاتووە کە دەفەرموێت: (یبعثُ اللَّهَ على رأسِ كلِّ مائةِ سنةٍ من یجدِّدُ لِهَذِهِ الأمَّةِ أمرَ دینَها)[1] واتە: خوای گەورە لەسەرەتای هەر سەدەیەکدا کەسێك دەنێرێ کە کاری ئەم دینە بۆ ئەم ئوممەتە نوێ بکەنەوە، زانای پایە بەرز ئیبن تەیمیەش (رەحمەتی خوای لێبێت) لەو جۆرە پیاوانە دەژمێردرێت.

ئیبن تەیمیە گەلێك هەڵوێستی هەبوو لە پێناوی سەرخستنی سوننەتدا وە لەو پێناوەشدا ئازار و ئەشکەنجەی زۆری چەشت، بەڵام لەگەڵ ئەو ئێش و ئازارەشدا نەك کۆڵی نەدەدا بەڵکو لە هەموو کەسێکی سەردەمی خۆی ناودارتر و بەهێزترو جێگیرتربوو لەسەر ڕاستی، وە لەوپێناوەشدا لە لۆمە ی لۆمەکاران هەرگیز سڵی نەدەکردەوە و زیاتر پاپەند دەبوو بە سوننەتەوەو، گوێی بەقسەو توانجی ئەم و ئەو نەدەدا ئەگەر لەو پێناوەدا ڕووبەڕووی دوژمنایەتی هەموو خەڵکیش ببوایەتەوە، لەو سەردەمدا زۆرێك کە لە ژێر پەردەی زانستدا خۆیان مەڵاسدابوو وەلە هەمووکەس زیاتر باوەشیانکردبوو بە دونیادا و پشتیان لەدوارِۆژکردبوو رۆڵی گەورە یان هەبوو لە دوژمنایەتیکردنی ئیبن تەیمیە.

---

[1] - صحيح أبي داود

ئیبن تەیمیە لە هەموو زانایان زیاتر کاری بەو فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ دەکرد: (من رأى منكم منكراً فليغيره بيده، فإن لم يستطع فبلسانه فإن لم يستطع فبقلبه وذلك أضعف الإيمان)[1] وە بەردەوام بوو لەسەر فەرمانکردن بە چاکە و نەهیکردن لە خراپە بەدەست و بەزمان.[2]

(الحافظ ابن كثير) سەبارەت بە ڕووداوەکانی٦٩٩هـ فەرموویەتی: لە١٧ی ڕەجەب ئیبن تەیمیە و هاوەڵەکانی بەسەر بارەکانی مەی خواردنەوەدا گەڕان و هەموویان تێکشکاندو ڕژاند و نەك هەر ئەوەندە بەڵکو تەعزیری مەی فرۆشەکانیشیان کرد، هەروەها ئیبن تەیمیە لە هەموو کەس زیاتر دژی ئەو کەسانە بوو کە هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەدەن و عیبادەت بۆ غەیری خوای گەورە دەکەن، لەم بارەوە (ابن كثير) ڕەحمەتی خوای لێبێت بۆمان دەگێڕێتەوە کە بەردێك هەبوو خەڵکی بۆ پیرۆزی سەردانیاندەکرد و شتیان بۆ سەردەبڕی، ئیبن تەیمیە و هاوەڵەکانی هەستان بە لەناوبردنی ئەو بەردە پارچە پارچەیانکرد و ئەو خەڵکەیان لەو شیرکە ڕزگارکرد، ئەمە لەساڵی ٧٠٤ ی هیجری.[3]

---

[1] - رواه مسلم (٤٩).

[2] - (بڕوانە: البداية والنهاية- ابن كثير ج١٢/١٤)

[3] -(البداية والنهاية-ابن كثير).

## شێخ لە ڕووبەڕو بوونەوی (قازان)ی پاشای تەتەرەکان

لە ڕاستیدا ئیبن تەیمیە (رەحمەتی خوای لێ بێت) ڕووی بکردایەتـە هـەر شوێنێك شێربوو لەبەپیرەوە چوون بەهاناوە هاتنی ئوممەتێك، ئەو کاتـەی کە تەتارەکان بەمەبەستی داگیرکردنی میسر ڕوویانکردە ئەو ناوچەیە خە ڵکەکە سامگرتووبوون، ئەوەبوو ئیـبن تـەیمیـە لەگـەڵ چەنـد ناودارێـك ڕێککەوتن کە چاویـان بـە قـازانی پاشـای تـەتارەکان بکـەوێت، قـازانی ستەمکار کە هەموو خەڵك سڵیان لێدەکردەوە ئیبن تەیمیە دووجار بـەرەو ڕووی بـــوەوە و زۆر بەوتـــەی تونـــد قســـەی لەگـــەڵ کـــرد و باســـی فەرموودەکانی خوا پاشان پێغەمبەری خوای ﷺ بـۆ کـرد لـە مەسـەلەی عەدل و دادپەروەری و شتی تر، وەلـە قسـەکانیدا دەنگـی بەسـەردا بڵند دەکردەوە و دەسـتی بـۆ سـنگی درێژدەکـرد و ئەوەنـدە لێـی نزیـك بـوەوە ئەژنۆیان بەریەککەوت، قازانیش گوێی گرتبوو و سەرنجی ئیبن تـەیمیـە ی دەدا بێئەوەی بەرپەچی بداتەوە ئەمەش لەبەر ئەوهەیبەتـەی ئیـبن تـە یمیە کە خوای گەورە خستبوویە دڵی پاشاوە، پاشـا پرسـیاری لەدەسـت و پێوەندەکانیکرد ئەو شێخە کێ بوو ؟!

پاشان وتی: من هەرگیز لـە وێنـەی ئـەوم نـەبینیوە بـەو ئەنـدازەیـە دڵـی دامەزراوبێت، وەقسەیەکم نەبیستوە بەو ئەندازەیە کار بکاتـە سـەر دڵـم

وەك قسەكانی ئەو، وە مەیلم بەلای كەسدا نەرِۆیشتووە بەو ئەندازەی بەلای ئەودا چووە..

لەو قەسە توندانەی ئیبن تەیمیە كەبەرەو ڕووی قازان كردی، پێیوت: تۆ بانگەشەی ئەوە دەكەیت كە موسڵمانی و قازی و پێشنوێژ و بانگدەرت لەگەڵە كەچی هاتویت غەزوی ئێمەت كرد، باوك و باپیرت كافربوون و ئەوەیان نەكرد كە تۆ كردت، ئەوان پەیمانیاندا و بەوەفا بوون بەڵام تۆ پەیمانتدا و پەیمانەكەتت شكاند و غەدرت كرد، پاشان ئیبن تەیمیە بەسەربەرزی و بەڕێز لێگیراویەوە پاشای جێهێشت و، خوای گەورەش بەنیەتی خۆی لەگەڵ كرد لەپاراستنی خوێنی موسڵمانان، وە ئەوەش بووە هۆی ئەوە زۆربەی دیلە موسوڵمانەكانی بەردەستی قازان ئازاد بكرێن و بگێڕدرێنەوە بۆ ناو كەس و كاریان و ناموسیان پارێزراوبێت.[1]

[1] - (بروانە: الأعلام العلية للبزاز/١٥،ابن تيمية د.محمد يوسف موسى ٨٣-٨٤).

## جیهادی ئیبن تەیمیە دژی تەتەرەکان..

ئیبن تەیمیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) خاوەن هەستێکی پڕ لە لێپرسراوێتی بوو، هەر ئەو هەستەشی پاڵنەری بوو بە جیهادکردن لە پێناوی خوای گەورە بەدڵ و دەروون و زمان و شمشێر.

لە ساڵی ٧٠٠ی کۆچی کاتێك کەتەتەرەکان هاتبوونە دەوروبەری شام و خەڵك دوچاری نارەحەتیەکی زۆر بوون سەبارەت بەپاشەکشەی سوپای میسر و وازهێنانی لەشام، ئەوەبوو ئیبن تەیمیە کەوتەڕێ بەرەورووی سوپای میسر کەدوای حەوت ڕۆژ ئەوسا گەیشتە لایان و لەڕۆژی هەشتەمدا ڕۆژی دووشەممە یازدەی جەمادی یەکەم گەیشتە قاهیرە، لەوێ چاوی بەبەرپرسانی دەوڵەت کەوت و لەنێویشیان چاوی بەسوڵتان ناصرکەوت و بەدەنگێکی دلێرانە هانیدان بۆ جیهادکردن لەپێناوی خوای گەورەدا و لەم بارەوە ئایەتی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەری ﷺ بۆ دەخوێندنەوە و باسی ئەو هەموو پاداشتەی بۆ دەکردن کەخوای گەورە دایناوە بۆ موجاهیدان.

میسریەکان بەم وتانەی ئیبن تەیمیە بەئاگاهاتنەوە و ورەیان بەرزبووەوە و داوای لێبوردنیان کرد کەپاشەکشەیانکردووە، وە هەڵوێستی ئیبن تەیمیە یان بەرزنرخاند و ڕێزی زۆریان لێنا..

ئەوەبوو کوشتاری تەتارەکانیانکرد و لەشام وە دەریانینان..[1]
لە سیفەتەکانی ئەو کەڵەپیاوە ئەوەبوو کەخۆی دەخستە هەموو شـوێنێك بەمەبەستی سەرخستنی ئیسلام بامەترسیداریش بوایە، بۆیە لـە جـەنگی دژی تـەتارەکان بەمەبسـتی بەرزکردنـەوەی ورەی سـوپاو هانـدانیان بـۆ جـــەنگکردن داوای لەئـــەمیری ســـوپاکرد کەلەشـــوێنێك رای بگـــرێ کەوێستگەی مردنبێت، ئەوبوو ئەمیرەکەش ڕەزامەندی نواند و بردیە ئەو شوێنەی کەتەتار لێوەی بەلێشاو وەك لافـاو هێرشـیاندەهێنا و بریسـکەی شمشێرەکانیانی لێدیاربوو وەپێیوت فەرموو ئەمە وێستگەی مردنە، ئیـبن تەیمیەش دەستەکانی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و لە خوای گـەورە پاڕایـەوە، دواتر وەك شێر بەرەو ڕووی جەنگەکە دەرچوو، ئەمیرەکـە دەگێڕێتـەوە و دەڵێ: جـەنگ دەسـتی پێکـرد و سـوپای هـەردوولا تێکچـڕژان و خـوای گەورەش سەرکەوتنی پێ بەخشین و ئیبن و تەیمیەشم بینی بەردەوام جـە نگی دەکرد و شوێن پاشاکانی تەتەر دەکەوت.[2]

---

[1] - (بڕوانە: العقود الدرية من مناقب شيخ الإسلام لابن عبد الهادی/١٣٥).
[2]- (بڕوانە: العقود الدرية- إبن عبد الهادی ص ١٧٧-١٧٨).

## نامەی ئیبن تەیمیە بۆ پاشای گاورەکان

ئیبن تەیمیە ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) هەرچی ڕێگای شەرعی هەبوایە بۆ سەرخستن و خەمخواردنی موسوڵمانان دەیگرتەبەر، ئەوەتا بۆ ڕزگارکردنی دیلەکانی موسڵمانان لەو ئازار و ستەمەی کەدەیان چەشت بەدەستی گاورانەوە، نامەیەکی بۆ (سرجوان)ی پاشای گاوران نارد کە تیایدا نوسیبووی: (لە ئەحمەدی کوڕی تەیمیە بۆ – سرجوان - ی گەورەی نەتەوەکەی ...، سڵاو لەشوێن کەوتوانی هیدایەت..

دواتر لەنامەکەیدا دەڵێت: ئەی پاشا، بەچ مافێك ڕشتنی خوێنی موسوڵمانانت حەڵاڵکردوە و ئافرەتەکانت بەکەنیزەك بردوون و دەستت بەسەر سەروەت و سامانەکانیاندا گرتووە؟

ئەی نەتزانیوە لەوڵاتی ئیمە ژمارەیەکی یەکجار زۆر لەئەهلی زیمە هەن و ئێمەش مامەڵەمان بەچاکە لەگەڵداکردوون؟ کەواتە چۆن بەم شێوەیە مامەڵە لەگەڵ دیلەکانی موسڵمانان دەکەن کە نە خاوەن ویژدانێك پێی ڕازیە و نەخاوەن ئاینیش؟!، ئەی ئەو دیلانە لەژێر چاودێری تۆ نین؟ ئەی پەیمانی مەسیح و سەرجەم پێغەمبەران ئامۆژگاری کردن نییە بەچاکە و چاکەکردن؟! ئەی کوا ئەمە؟! پاشان زۆرێك لەو دیلانە بگرن ؟! ئایا دڵنیایی لەوەی کە موسوڵمانان وەڵامی ئەم غەدرەتان نادەنەوە کەخوای

گەورە سەریاندەخات و پشتیوانیانە بەتایبەتی لەم ساتەوەختانەدا کە ئوممەت هەمووی بەرە وپیری جیهادهاتوون و خۆیان بۆ ستەمکار ئامادەکردووە؟

وە پیاوچاکان و دۆستانی خوا ڕوویان کردۆتە خوا پەرستی، وەلەسەر سنوورەکانیشیان ئەمیری بەزەبر کاریان گرتۆتە دەست¬و لە زۆربوونیشدان و هێندێك لەشوێن پەنجە و دەستیشیان دەرکەوتووە..

پاشان موسولّمانان پیاوی فیداکاری وایان هەیە کەپاشاکان لە نێو پێخەفەکانیاندا دەکوژن، وەیا لەسەر وڵاخەکانیان، پاشاش هەواڵی ئەم جۆرە پیاوەی پێگەییوە لە رابردو و وەلە ئێستاشدا، وە هەروەها موسولّمانان پیاوچاکی وایان تیایە کە خوای گەورە داواکانیان ڕەتناکاتەوە و نائومێدیان ناکات، ئەوانەی کەپەروەردگار تورە دەبێت بۆ تورەبوونەکەیان و ڕازی دەبێت بۆ ڕەزامەندیەکەیان، ئەوەتا تەتەرەکان لەگەڵ زۆری ژمارەیان و کەبەناویش موسولّمان بوون کاتێك کە موسولّمانان لێیان توورەبوون بەڵا دەورەیدان کەوەسف ناکرێت، کەواتە چۆن ڕەوایە نەتەوەیەك کەهاوسێی موسولّمانانن لەزیاتر لەلایەك کەچی بەم جۆرە مامەڵەیان لەگەڵ دەکەن کەهیچ خاوەن ئەقڵێك پێی رازی نیە نەموسڵمان و نەئەهلی زیمەش.[1]

---

[1] - (بڕِوانە: مجموع الفتاوی ٣٢٨/٢٨).

## ئیبن تەیمیە و زیندان.!

زانایەکی موجاهید ئەمە حاڵیبێت، ئەوا سەیرنیە کەدوژمنی زۆربن لەو بەناو زانایانەی کە بەمەبەستی دنیاخۆری بەردەوام لەوتە و نوسراوەکانی ئیبن تەیمیە دەگەڕان بەڵکو هەڵەیەك یا کەم و کورتیەکیان دەستبکەوێت تاوەکو گەورەی بکەنەوە و بیکەنە هەرا لەسەری، کە چاکیش دەیانزانی مرۆڤ پارێزراو نیە لەهەڵە، بۆیە بۆ ئەم مەبەستە چەندان جار لای سوڵتان شکایەتیان لێکرد و هەرجارەی بەشتێك تۆمەتباریاندەکرد، جارێك بەبیدعە و جارێکی تریش بە لادان لە ئاین.

بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانە ئیبن تەیمیە ئەوسوارچاکە بوو کە ئەم جۆرە فێڵ و چاوبەستەیە لەسەری تێپەڕ نەدەبوو، بۆیە بەبێ موجامەلە و نەرمی نواندن بەرەو ڕووی ئەو تەڵەکەباز و خاوەن بیدعانە دەوەستایەوە و لەوتنی قسەی حەق هەرگیز لەلۆمەی لۆمەکاران نەدەترسا، بۆ ئەو مەبەستەش چەندان جار لەسەر داوای سوڵتان بەرەو ڕووی ئەم جۆرە کەسانە بووەتەوە لە مەجلیسی سوڵتاندا.[1]

[1] - (بروانە:البداية والنهاية- إبن كثير ١٤/٣٦).

ئیبن تەیمیە لەو بارەیەوە قەت تووشی لاوازی و سستی نەدەبوو سەرە ڕای ئەوەی کە چەندان جار حوکمی زاڵمانەیان بەسەر دابوو بەزیندانی کردن، تا وای لێهاتبوو ئەم پێشەوا بەڕێزە لەسەر وتنی حەق لە زیندانێکەوە دەردەچوو بۆ زیندانێکیتر، سەرمەشقیشی لەمە پێغەمبەر یوسف بوو (علیه السلام) کە دەیفەرموو: (ربی السجن أحب إليَّ مما يدعونني إليه)[1]

ئەوەبوو جارێکیان ئەم زانا بەڕێزە چەند ڕۆژێك لەبورجێك زیندانیانکردبوو تا لەشەوی جەژنی ڕەمەزان گواستیانەوە بۆ زیندانی ناسراو بە(الجُب)، دواتریش نوسراوی سوڵتان نێردرا بۆ شام کەزۆری لەخەڵکدەکرد بەتایبەتی شوێن کەوتوەکانی کەلەبیروباوەری ئیبن تەیمیە لابدەن دەنا زیندان چارەنوسیانە، ئەمەشیان جاڕ دەدا لە مزگەوت و بازارەکان، بەنیسبەت ئیبن تەیمیەش ساڵێك و چەند مانگ لەزیندان مایەوە بێئەوەی پاشگەز بێتەوە لەبیرو بۆچوونەکانی بەرامبەر بەئازاد کردنی.

ئیبن تەیمیە دوای دەرچوونی لەزیندان چوو بۆ قاهیرە و لەوێ خەریکی بڵاوکردنەوەی زانستبوو لەمزگەوتەکان و شوێنە گشتیەکاندا خەڵکی سوودیان لێدەبینی، بەڵام ساڵێك بەسەر ڕزگاربوونی لەزیندانی کردنەکە

[1] - سورة يوسف.

ی یەکەمیدا تێنەپەڕیبوو کەبەهۆی شکایەتی سەرانی خاوەن بیدعەوە لەمیسر دووبارە خرایەوە زیندان، دواتر خستیانە بەردەمی کەیا لەدیمەشق و قاهیرە دادەنیشێ بەچەند مەرجێك وەیا بەردەوام دەبن لەزیندان کردنی، ئەویش زیندانی هەڵبژارد، ئەوەبوو ناردیانەی زیندانی (القاچی) ناسراو لەمیسر، لەزیندانیشدا ئیبن تەیمیە هەربەردەوام بوو لەسەر ڕێرەوەکەی خۆی لەبلاو کردنەوەی زانست و پشتگیری قورئان و سوننەت تەنانەت لە زیندان ئەمیرو ناودارەکان خەڵکیتریش دەهاتنە لای بۆفەتوا و فێربوون، قوتابیەکانیشی هەرکات بیانویستبایە دەچوونە لای بۆ ڕێنماییو ئامۆژگاری.

(ابن القیم) کەیەك لەناودارترین قوتابیەکانی بوو دەڵێت: (ئێمە گەر دنیامان لێویێك بهاتبایەوە و هەستمان بە تەنگی بکردبایە دەچوینە سەردانی مامۆستاکەمان لە زیندان).[1]

لە مانگی شەوالی ٧٠٩ی کۆچی بەفەرمانی پاشا (الناصر محمد بن قلاوون) دەرچوو لە زیندان و هێنایانەوە قاهیرە، لەوێ ئیبن تەیمیە بەردەوامبوو لەفێرکردنی خەڵك و فەتوادان، دواتر دوای حەوت ساڵ لە دوورکەوتنەوە لەساڵی ٧١٢ك گەڕایەوە دیمەشق .

[1] - ( بڕوانە: إبن تیمیه د. محمد یوسف موسی ص ١٠٤-١٠٦).

له ساڵی ٧١٨ك فەرمانێكی سوڵتان دەرچوو بەرەتكردنەوەی فەتواكەی ئیبن تەیمیە لەسەر مەسەلەی (نەكەوتنی تەڵاق )و خەڵكیش لەمە ئاگاداركرایەوە، بەلاِم ئیبن تەیمیە پابەندنەبوو بەمەوە وە ووتی: (من ناتوانم زانست بشارمەوە ) بۆیە دووبارە خرایەوە زیندانی (القلعە) كەلەوێ پێنج مانگ و ١٨ رۆژی بەسەر چوو تاوەكو دواتر دەرچوو لە زیندان و گەڕایەوە سەررێِبازەكەی خۆی لەفێركردنو فەتوادان.[1]

دواتر نەیارەكانی هەستان لێیكەوتنە هەرا لەفەتوایەكی دەربارەی مەسەلەی ( شد الرّحال )ی ناسراو كە بووە هۆی دەستگیركردنی بەفەرمانی سوڵتان لەساڵی ٧٢٨ ك، وەبردیان بۆ زیندانی (القلعە) و فەتوا دانیان لێ قەدەغەكرد تەنانەت كۆمەڵێك لە قوتابیەكانیشیان بەفەرمانی جێگری سوڵتان خستە زیندانەوە، ئا لەم هەڵوێستانەدا بۆمان بەدەر دەكەوێت كە ئیبن تەیمیە ژیانی خۆی تەرخانكردبوو بۆ خوای گەورە تەنانەت زیندانیش كۆڵی پێنەدەدا لەو ڕێبازەی بۆسەرخستنی قورئان و سوننەت.

---

[1] - (بڕوانە: البداية والنهاية ٨٧/١٤).

## وەفات کردنی ئیبن وتەیمیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)

ویستی خوای گەورە وابوو کەئیبن تەیمیە نەخۆش بکەوێت لـە زینـدانی (القلعە) بۆ چەند ڕۆژێك، ئەوەبوو (شمس الدین )ی وەزیـر هاتـە لای لـە زیندان و داوای لێبوردنی کرد ئەویش پێی وت: (گەردەنم ئازاد کردیـت و هی هەموو ئەوانەش کەدژایەتیمیان دەکردو نـەیانـدەزانی کـەمن لەسـەر حەقم... جگە لەدوژمنانی خوا پاشان پێغەمبەرەکەی ﷺ)[١]

ئیبن تەیمیە لەزیندان مایەوە تـاوەکو لەشـەوی ٢٢ی زولقەعـدەی سـاڵی ٧٢٨ ك وەفاتیکرد، بەڕاستی ئەم ڕووداوە زۆرسەختبوو لەسەر خـەڵکـی، جەنازەکەیان لە زیندان هێنایە دەر و لەمەراسیمی ناشـتنیدا خـەڵکـانێکی یەکجار زۆر بەشداریانکرد تەنانەت دەنگی گریانیان بەرز دەبووەوە و نـە یان دەتوانی بیشارنەوە.

(إبن کثیر) ڕەحمەتی خوای لێبێت لەوبارەیەوە دەڵێت: (لەو ڕۆژەدا کەس بەدوا نەکەوت مەگەر ئەوەی کـە نـەیتـوانی بێـت، تەنانـەت ئـافرەتێکی زۆریش ئامادەبوون کە ژمارەیان بە ١٥ هەزار دەخەمڵێندرا ئەوە جگە لەو

---

[١] - ( بڕوانە: مناقب شیخ الإسلام ـ للبزار ص ١٨).

ئافرەتانــەی کــە لەســەربانەکان و شــوێنیتر وەســتابوون، وەژمــارەی پیاوەکانیش بە ٢٠٠ هەزار دەخەملێندرا). [١]

(الحـافظ عمـر بـن علـی البـزار)یش دەڵێـت: (ژمـارەی ئـەو پیاوانـەی کەئامادەبوون لە٥٠٠ هەزار زیاتر بوون)[٢]

وە دوای تــەوابوونی نــوێژکردن لەســەری کەکۆمــەڵ لــەدوای کۆمــەڵ نوێژیاندەکرد لەسـەری، بردیـان بـۆ گۆڕسـتانی (الصـوفیه) و لەتەنیشـت (شرف الدین عبد الله ) ی برای ناشتیان.[٣]

ئیبن تەیمیه ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) کـۆچیکرد، بـەڵام باسـکردنی بـۆ ماوەی ٧٠٠ ساڵە تا ئیستا هەر بەردەوامە لەنێوانماندا، وەویسـتی خـوای گـەورە وابـوو کـەنوسراوەکانی و ڕێبازەکـەی ببێتـە چرایـەك کـەڕێگای نەوەکانی دوای خۆی ڕووناك بکاتـەوە، ئوممـەت ئـەمڕۆ پرسـیاردەکات: ئایا بانگەشەکەرەکانی زانست و ئـاین لـەکوێن؟ ئایـا بانگەشـەکەرەکانی خۆش ویستنی ئیبن تەیمیه و شوێن کەوتنی ڕێبازەکەی لەکوێن؟ ئەی بۆ وەك ئیبن تەیمیه جوامێرانە دژی دەسەڵاتدارە سـتەمکارەکان ناوەسـتنەوە بەتایبەتی لـەم ڕۆژگارەمـان کـە جیهـانی ئیسـلامی دەناڵێنێـت بەدەسـت جەور و ستەمی دوژمنانی ئیسلام ؟!! .

---

[١] - (بڕوانە: البدایةو النهایة ١٣٦/١٤).

[٢] - (بڕوانە: الأعلام العلیة فی مناقب شیخ الإسلام إبن تیمیة ص ١٩).

[٣]- ( بڕوانە: إبن تیمیه ـ د. محمد یوسف موسی ص ١١١).

## چەند ووتەیەکی ئیبن تیمیە

یەکەم: شـێخ الاسـلام ئیـبن تیمـیە (رەحمەتـی اللـە تعـالی لێبێـت) دەفەرموویێت: (فمن لم یستسلم لله لم یکن مسلماً، ومن استسـلم لغـیره کـما یستسلم له لم یکن مسلماً، ومن استسلم له وحده فهـو المسـلم)[1] واتـە: هەر کەسـێك خـۆی نەداتە دەسـت پەروەردگـار و تەسـلیمی نەبێـت ئەوە موسوڵمان نییە، وە هەرکەسێکیش خۆی بەتەواوی بداتە دەسـتی غەیـری پەروەردگـار وەك چـۆن خـۆی تەسـلیمی پەروەردگـار دەکـات ئەوەش موسوڵمان نییە، وە هەرکەسێکیش خۆی تەسلیمی پەروەردگـار بکـات بە تەنها ئەوە موسوڵمانە.

ـ بێگومان بەو کەسەی ئیسلام بەرنامەی بێت دەوترێت موسوڵمان، بەڵام دەبێ ئەو کەسە خـۆی تەسـلیمی الـله کردبێـت، گیـان و رووح و مـاڵ و هەموو شتێکی کە لای خۆشەویستە و هەیەتی بیکاتە قوربـانی ڕێبـاز و شەریعەت و مەنهەجی لاالە الاالله ئەوکاتی پێی ئەوترێت موسـوڵمانێکی کامڵ و تەواو، کەوایە لە خۆت بپرسە کە بەڕاستی خۆت تەسـلیمی اللـە کردووە؟ یاخود نا هەر لەسەر ڕێچکەو ڕێبازی جاهیلیەتی کە تەنها بە ناو موسوڵمانیت.

---

[1] - النبوات لابن تیمیة (١/ ٣٢٨)

دووەم: ئیبن تیمیه (ڕەحمەتی الله تعالی لێبێت) دەفەرموویێت:(وليس لأحد الأبوين إلزام الولد بنكاح من لا يريد، وإنه إذا امتنع لا يكون عاقاً كأكل ما لا يريد)[1] واتە: بۆ باوک و دایک نیە کە مناڵەکەیان پەیوەست بکەن بە هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو کەسەی کە نایەوێت، ئەگەریش هاوسەرگیری نەکات ئەوا بە بێفەرمانی باوک و دایک ناژمێردرێت، هەر وەکو ئەوا وایە کە ئەو خواردنەی حەزی لێ نەبێت نایخوات.

- بێگومان هەموو کەس لە دونیا ئارەزووی شتانێک دەکات، و ڕقی لە شتانێکە، وە هیچ شتێک بە زۆری ناکرێت و دەبێ بۆ هەڵبژاردنی هەر شتێک ئارەزوو و حزی خۆی لەسەر شتەکە بێت کە هەلیدەبژێرێت، وە زۆرکردن لە لە کوڕ یان کچ بۆ هاوسەرگێری شتێکی ناپەسەند و خراپە، چونکە ژیانی هاوسەریەتی تا مردنە، نەک یەک ڕۆژ، یان کاتێکی کەم بۆیە دەبێ کوڕ و کچ بە ئارەزووی دڵی خۆیان بێت، کە کێ هەڵدەبژێرن، بەڵام دەشێت چاکە و خراپە لە هەڵبژاردنی کەسەکان بۆ کوڕ و کچانمان ڕوون بکەینەوە چی چاکە و خراپە ئەوکات، ئارەزووی لەو کوڕە یان کچە بوو هەلیدەبژێرێت، باوک و دایک نابێت زۆر لێکەربن لە کوڕیان یان کچ کە کەسێک هەڵبژێرن نەچێتە دڵیان، گوێدار نەبوونی دایک و باوک لە بەزۆر بەکەسێکی بدەن منداڵەکەیان تاوانبار نابێت.

---

[1] - الاختيارات ص ٣٤٤.

سێیەم:

شيخ الإسلام ابن تيميه (ڕەحمەتی الله تعالی لێبێت) دەفەرمووێت:

(فأن معرفة مراد الرسول، ومراد الصحابة هو أصل العلم ، وينبوع الهدى)[١].

واتە: بەڕاستی زانینی مەبەستی پێغەمبەر ﷺ و مەبەستی هاوەڵان (رضي الله عنهم) بنچینەی زانست و سەرچاوەی هیدایەتە.

ـ دەبێ بێگومان بزانین کە مەبەست و داخوازی هەموو پێغەمبەران (سەلامی اللەیان لێبێت) بۆ تەوحید بووە، و تەنها بۆ تەوحید هاتوونە بۆ مرۆڤایەتی، واتە بە تاک دانانی الله تعالی لە حوکم و لە بەڕێوردنی هەموو کارەکانی دونیا، وە مەبەستی پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ و هاوەڵو قوتابیەکانیشی هەمان مەبەست بووە، نەک جیاکردنەوەی دین لە دەولەت و تەنها نوێژ و ڕۆژوو بگری تەواو تۆ بەهشتییت، بۆیە مەبەستی پێغەمبەرمان ﷺ کە جێبەجێکردنی شەریعەتی الله بووە لەسەر زەوی، کە هەموو قوربانیدانێکیان لە پێناو ئەومەبەستە بوو، بۆیە ئێمەی موسوڵمان کە خۆمان پێ شوێنکەوتەی ئەو پێغەمبەرەیە ﷺ دەبێ هەمان ڕێچکەو ڕێبازی ئەو بگرینە بەر و شوێن پێی ئەو بکەوین بست بە بستێ، بۆیە زانینی مەبەستی ڕاستەقینەیان و جێبەجێکردنی واتە تۆ لەسەر ڕێبازی ڕاستەقینەی و هیدایتدراویت.

---

١ - ـ مجموع الفتاوى [ ٥/ ٤١٣ ]

## چوارەم:

شیخ الإسلام ابن تیمیه (ڕەحمەتی الله تعالی لێبێت) دەفەرمووێت:

(من فارق الدلیل ضل السبیل، ولا دلیل إلا بما جاء به الرسول ﷺ)[1]

واتە: هەرکەس بۆ ئەنجامدانی دینداری لە بەڵگە جیا ببێتەوە وەك کەسی ڕێبواری بیابان وایە، چۆن ئەگەر چاوساغەکەی لێی جیاببێتەوە ڕێگا ون دەکات ئەو کەسەش بەهەمان شێوە، وە هیچ شتێکیش نابێتە بەڵگە بێجگە لەوەی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ هێناویەتی کە قورئان و سوننەتە.

بەکورتی واتە هەرکەس خۆی پێ موسوڵمان بوو بەس بۆ ئەنجامدانی کارەکان واز لە بەڵگە بێنێت، بەڵگەش واتە قورئان و سوننەت نەک بە ئارەزووی خۆی کاروکردەوە ئەنجام بدەیت، بلێی ئەوە باشە و خراپە ئەوە گومڕاییە هەر وەکو باڵندەیەکە لە ئاسمان بەبێ باڵ فڕێی بدەیتە خوارەوە نەزانێت دەکەوێتە کوێ بۆیە هەرکەس بێ بەلگە کاروکردەوە بکات بەم شێوەییە، کەوایە ئیماندارى ژیر و ئاقڵ هیچ شتێک لە ژیان ناکات بەبێ فەرمانی قورئان و سوننەت نەبێت، تەنها کار بە قورئان و سوننەت دەکات.

[1] - مفتاح دار السعادة ١/٣٠٤

## پێنجەم:

شیخ الإسلام ابن تیمیه (ڕەحمەتی الله تعالی لێبێت) دەفەرمووێت:

(إعتقاد الحق الثابت يقوي الإدراك ويصحِّحُه)[1].

واته: بیروباوەڕی ڕاست و جێگیر درك پێکردن بەهێز دەکات و ڕاستی دەکاتەوە.

کەسی خاوەن عەقیدەی کامڵ که بیروباوەڕی لەسەر قورئان و سوننەت دامەزراوه به ڕاست و دروستی دوور له هەواو ئارەزووی مرۆڤەکان، چۆن الله پێی ڕازیه، پاشان پێغەمبەرەکەی ﷺ پێی ڕاگەیاندووینه بەم شێوەیه تێگەیشتین له ئیسلام و تەوحید ئەوکات دەبینه مرۆڤێکی ژیر و خاوەن ئەقڵێکی تیژو ووردبین بۆ هەمووشتەکان، درككردن بەشتەکان و جیاکردنەوەی خراپ و باش و حەق و ناحەق، واته ڕووبەڕووی هەموو کێشه و تاقیکردنەوەیەك دەوەستین هیچ گێژەڵۆك و باوبۆرانێك نەتوانێ زەفەر ببا و لەناومان ببات، بۆیه الله تعالی دەفەرمووێ:

[1] - الانتصار لأهل الأثر ص ١٥

(وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا مَا يُوعَظُونَ بِهِۦ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا)[1] واته: جا ئەگەر بەڕاستی ئەوانە بەگوێرەی ئامۆژگاری و فرمانی ئێمە ڕەفتاریان بکردایە، ئەوە چاکتر بوو بۆیان و دامەزراوترو چەسپاوتر دەبوون لەسەر حەق و ڕاستی.

زۆر ڕوونە بزانە اللە دەفەرمووێ هەرکەس بە گوێرەی قورئان و سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ بجولێتەوە ئەوا سەرکەوتوو بەختەوەر دەبوون لە ژیانی دونیا، لە دوارِۆژیش بەهەشت پاداشتیان دەبێت، کەوایە با خۆمان شارەزای عەقیدەی ئیسلامی بکەین تاوەکو سەرفراز و بەختەوەربین.

---

[1]- النساء ٦٦

شەشەم:

شیخ الإسلام ابن تیمیه (ڕەحمەتی الله تعالی لێبێت) دەفەرمووێت:

(وَالْمَطْلُوبُ مِنْ الْقُرْآنِ هُوَ فَهْمُ مَعَانِيهِ وَالْعَمَلُ بِهِ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ هَذِهِ هِمَّةَ حَافِظِهِ لَمْ يَكُنْ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ وَالدِّينِ)[1].

واتە: ئەوەی کە داواکراوە لێمان بەرامبەر بە قورئان ئەوەیە کە لە ماناکانی تێبگەین و کاری پێ بکەین، ئەگەر ئەمە ویستی ئەو کەسە نەبێت کە لەبەری دەکات ئەوە کەسێك نیە لە ئەهلی عیلم و دین.

بەکورتی دەبێ ئامانجی ئەو کەسەی قورئان دەخوێنێ و لەبەری دەکات ئەوەبێت لە فەرمان و نەهیەکانی الله تێبگات و جێبەجێیان بکات، ئەگەر وانەبوو تەنها بۆ خوێندنەوە بوو بێ کردار سوودی نیە گەر تۆ حافز قورئانیش بیت چونکە قورئان پرۆگرام و یاسا و مەنهەجی ژیانە دەبێ ئەو یاسا و ڕێسایانە جێبەجێ بکەین کە تێدا هاتوون، پاشان عەقیدەو بیروباوەڕەکەمان لەسەر ڕێبازی پێغەمبەری ئازیز ﷺ بێ، نەوەکو عەقیدەمان لەسەر باتل و ناحەق بوو ئەوکات حافز قورئان بین، بەکورتی گرنگترین شت لە دونیا بۆ ئیماندار عەقیدەو بیرو باوەڕەکەیەتی.

---

[1] - مجموع الفتاوی (٢٣ / ٥٥).

هەروەکو لە جوندوبی کوڕی عبداللەوە دەفەرمویت: لەلای پێغەمبەر ﷺ بووین هەمووومان گەنجانێکی بەهێز بووین فێری ئیمانی دەکردین پێش ئەوەی کە قورئانمان فێر بکات پاشان قورئانی فێر دەکردین ئیمانمان پێی زیادی دەکرد.

(عَنْ جُنْدُبِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، قَالَ: " كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ وَنَحْنُ فِتْيَانٌ حَزَاوِرَةٌ، فَتَعَلَّمْنَا الْإِيمَانَ قَبْلَ أَنْ نَتَعَلَّمَ الْقُرْآنَ، ثُمَّ تَعَلَّمْنَا الْقُرْآنَ، فَازْدَدْنَا بِهِ إِيمَانًا)[1].

بۆیە گرنگ عەقیدە و ئیمانە کە تۆ عەقیدەو ئیمانێکی بتەوت هەبوو هیچ تەوژم و فیکرێک نەیگۆریت ئەوکاتی قورئان خوێندن و لەبەرکردنەکەت سوودی دەبێ وات لێدەکا زیاتر حەق و ڕاستی بناسیت پێیەکانت ڕاگیراوتربێ لەسەر حەق، الله تعالى بمانکەتە ئەهلی قورئان و ئەهلی خۆی، امین،

[1]- رواه ابن ماجه (٦١)

حەوتەم:

شیخ الإسلام ابن تیمیه (ڕەحمەتـی اللـه تعـالی لێبێـت) دەربـارەی پـلە و پایەی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت:

(هم أعظم خلق الله محبة لله ورسوله وبذلا لنفوسـهم وأمـوالهم في رضى الله ورسوله ﷺ على وجهٍ لا يحلقهم فيه أحد من هؤلاء المتأخرين)[1].

واتە: ئەوانە گەورەترین دروستکراوانی اللـەن لەڕووی خۆشەویسـتییان بۆ الله تعالی پاشان پێغەمبەرەکەی ﷺ و بەخشـینی نەفـس و ماڵیـان لە ڕازیبوونی اللـه تعـالی پاشـان پێغەمـبەرەکەی ﷺ بەشـێوەیەك کە هـیچ کامێك لەمانەی دواییینەکان پێیان ناگەنەوە.

پوختەی قسان: هاوەڵان (ڕەزای الله تعالی یان لێبێت) کەسانێکی بۆ اللـه سولحاو و دونیا نەویست بوون، بەتەواوی لە ژیـان تێگەیشـتبوون بـۆیە گیانی خۆیان کردە قوربانی بۆ دینی الله ژیانی خۆیـان و مـاڵ و منـداڵ و ژن و هەمـوو شـتێکیان کـردە قەڵغـان بـۆ پاراسـتنی پێغەمـبەر ﷺ و شەریعەتی لااله الاالله لەسەردەمێک کە هەمـوو خەڵـک و کۆمەڵگـا لە دژی پێغەمبەر ﷺ و ئیسـلام هەسـتانەوە و هەمـوو خـزم کەس و کـاری پێغەمبەر ﷺ دژی پێغەمبەر ﷺ و ئیسـلام بـوون، تەنهـا هـاوەڵە ئـازا و

[1] - الفتاوى الكبرى ٢ / ٤٠٨.

جوامێرەکان نەبێ سینگی خۆیان کردە پەرژین بۆ پاراستنی ئیسلام لە کوفر، بۆیە هەرچی بلێین لە دونیا نەویستی و الله وویستی و قوربانیدانی ئەم هاوەڵانە هەر کەمە، هیوادارم ژیانی ئەم کەلە پیاوانە بخوێننەوە تاکو شارەزای ئەو هاوەڵ و هاوڕێ و قوتابیانەی پێغەمبەری ئازیز ﷺ بن، کە مێژوو جارێکی تر نمونەی ئەم پیاوانە بەخۆیەوە نابینێت.

الله تعالی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکانی و شەهیدەکان حەشرمان بکات امین.

## هەشتەم:

شیخ الإسلام ابن تیمیه (ڕەحمەتی الله تعالی لێبێت) دەفەرمووێت:
ڕێگەی پیاوچاکان بریتیه:
(طريقة الصالحين: طاعة الله ورسوله و ملازمة الكتاب والسنة)[١].
واته: گوێڕایەڵی کردنی الله تعالی پاشان پێغەمبەری ئازیز ﷺ وە پابەندبوون بە قوڕئان و سوننەتەوە.

ڕێگـای پیـاو چاکـان چـیه، ئەوەیە کە پیـاو چاکـان لەسـەری بـوونە کە پابەندبوونیان بە قورئان و سوننەتی پێغەمبەری الله ﷺ بووە، هەر شت و فەرمان و ئەمرێک لە لایەن الله تعالی پاشان پێغەمبەری ئازیز ﷺ بـووە ئەو پیـاو چاکـانە بـێ ئەوەی بڵـێن ئەوە چـیه، ئەوهـا نەبـێ ئەوهـا ئەوان تەسلیم فەرمانەکان بوونە، بۆیە دەبێ ئێمەش چاو لەو پیاو چاکانە بکەین کە فەرمانمان پێدەکەن گوێڕایەلی الله تعالی پاشان پێغەمبەری ئـازیزﷺ بین، نەک ئەو بەناو پیاو چاکانەی ئەمـری شـیرک و کوفرمـان پێـدەکەن شێخ و قەبر و گۆڕ بپەرستین و بەندەی سەرۆک و فیسـار و فـلان بـین، ئەمانە پیاو چـاک نـین بەڵکـو شـەیتان و تـاغوتن، پیـاو چاکـان ئەوانـن لەسـەر ڕێبـازی قورئـان تـاکو مـردن گۆڕانکاریـان بەسـەر نـاهێ لە عەقیدەیان، الله تعالی ڕێنمونی ڕێگەی حەقمان بکات.. امین

---

١- [جامع المسائل ٥ / ٢٢٥ ]

**نۆیەم:**

**شیخ الإسلام ابن تیمیه (ڕەحمەتی الله تعالی لێبێت) دەفەرمووێت:**

**(والنبي ﷺ يجب علينا أن نحبه حتى يكون أحب إلينا من أنفسنا وآبائنا وأهلنا وأموالنا، ونعظمه ونوقره، ونطيعه ظاهراً وباطناً، ونوالي من يواليه، ونعادي من يعاديه، ونعلم أنه لا طريق إلى الله إلا بمتابعته ﷺ)[1].**

**واتە: پێغەمبەری ئازیز ﷺ واجبە خۆشمان بوێت بەڕاددەیەک خۆشەویستر بێت بەلامانەوە لەخۆمان و باوک و باپیرمان و خاو و خێزان و سەرمایە و سامانمان و بەگەورەی بزانین و ڕێزی بگرین و بەئاشکرا و پەنهان گوێڕایەڵی بکەین و دۆستایەتی کەسێ بکەین کە دۆستایەتی دەکات و دژایەتی کەسێ بکەین کە دژایەتی دەکات و بزانین کە هیچ ڕێگەیەک بەرەو ڕەزامەندی الله نیە ئیللا بە شوێنکەوتنی پێغەمبەری ئازیز ﷺ نەبێت.**

**هەموو دین و بەرنامە و پڕۆگرام و وڵاتان سەرکردە و پێشەوای خۆیان هەیە، پێشەنگ و پێشەوای موسوڵمانانیش پێغەمبەری ئازیزە ﷺ، دەبێ ئیماندار بۆ هەموو کار و فەرمانێک بست بەبستی چاو لەم پێغەمبەرە ﷺ بکات، تاکو سەرکەوتوو سەرفڕازبێت، سەرۆک و پێشەوا باتڵ و پوچەکانی دونیا خەڵکی بۆیان خۆی بەکوشتن ئەدات و بە جۆرێک ئەیان**

---

[1] - (الصارم المسلول على شاتم الرسول، ١٩٨).

پەرستن و سـوژدەیان بـۆ دەبەن، بەڵام ئیمانـدار دەبـێ خۆشەویسـتی ئەم پێغەمبەره ﷺ تێکەڵ بە خـوێن و دەمـاری بکـات، خۆشویستنیشـی واتە شـــوێنکەوتنی شـــوێن پێیەکـــانی چـــونکە تەنهـــا شـــوێنکەوتنی و گوێڕایەڵبـــوونی گشـــت فەرمـــان و نەهیەکـــانی و شـــوێنکەوتنی ئەم سەرکردەیە مایەی بەختەوەری دونیا و دوارۆژە، گشت پێشەواکانی تـری دونیـا ڕێگایـان نەهـامەتی و کەنـدو بەهـیلاک چـوونە، بـۆیە واجـبە لە سەرمان ئەم ئازیز و نوری چاومان لە گیان و ڕووح و هەموو شتی دونیـا لامان خۆشەویستر بێت، تاکو خۆشبەختی دونیا و دوارۆژ بین.

دەیەم:

شیخ الإسلام ابن تیمیه (ڕەحمەتی الله تعالی لێبێت) دەفەرمووێت:

(من أعظم خبث القلوب: أن يكون في قلب العبد غل لخيار المؤمنين)[1].

واتە: یەکێک لە گەورەترین بۆگەنی دڵەکان ئەوەیە لە دڵی بەندەیەکدا ڕق و کینە هەبێت بۆ ئیماندارە چاکەکان.

ئیمانداری ژیر و ئاقڵ ئیمانەکەی ڕێگەی نادات ڕق و کینی لە دڵ بێ بەرامبەر برا ئیماندارەکانی، بۆیە ئەوەی ڕقی لە دڵ بێ دژی ئیماندارەکان بزانە دڵ نەخۆش و دووڕوو و مونافیقە، چونکە تەنها دووڕووەکان نەخۆشی لە دڵیانە بەرامبەر ئیمانداران و حزیان بەسەر کەوتن و خۆشی و بەختەوەری ئیماندار ناهێ و ڕق و بوغز لە دڵیانە، بۆیە ئەمانە خاوەنی خراپترین دڵ و بۆگەنترین دڵیان هەیە.

---

[1] - [منهاج السنة:١/٢٢]

## یازدەیەم:

شیخ الإسلام ابن تیمیه (ڕەحمەتی الله تعالی لێبێت) دەفەرمووێت:

(كثيرٌ من الناس إذا أوذي على الحق تركه)[١].

واته: زۆربەی خەڵكی، كاتێ ئازار و ناڕەحەتی دێتەڕێـی لەسـەر (حەق)، وازی لێ دەهێنێ!!

- موسـولْمانـی ئێسـتاكه تەنهـا بەنـاو موسـولْمانه، دوور له نـاوەڕۆک و مەنهەجی موسولْمانه پیشینەكانی سـەلەفی سـاڵح كه تەواوی ژیانیـان له پێناو الله بردە سەر، له خۆشی و ناخۆشی، له سەر بەرنامەكەیان ئەزیەت و ئازاری زۆریان چێشت، بەڵام نەگۆڕان و سارد نەبـوونەوە، بگـرە زیـاتر تونـد و تـۆڵتر دەبـوون لەسـەر ئـیمان و عەقیـدەكەیان، چـونكه خۆشـی بەهەشت و ڕەزامەندی الله دڵیانی داگیركردبوو، بۆیه به باشـترین جیـل و نەوەی ئیسلام دادەنرێن، موسڵمان گەر خۆی پێ ئیمانـداره نـابێ بگۆڕێـت گەر مردن و گیـانی خۆشـی لەسـەر دانابێـت، بـۆیه خۆشـبەحاڵی ئەوەی هەموو كات بەندەی اللەیه و گۆڕانكاری بەسەر ناهێت، تا كۆتا هەناسـه، الله تعالی لەوان حسابمان بكـات و تووشـی تـاقیكردنەوەیەكمان نەكـات نەتوانین سەبر و ئارامی لەسەر بگرین.

---

[١] - جامع المسائل ٨ / ٢٣٢

## دوازدەیەم:

شیخ الإسلام ابن تیمیه (ڕەحمەتی الله تعالی لێبێت) دەفەرموێت:

(السكوتُ بلا قراءة، ولا ذكر ، ولا دعاء ليس عبادة ، ولا مأمورا به، بل يفتح باب الوسوسة ، فالاشتغال بذكر الله أفضل من السكوت)[1].

واتە: بێدەنگی بەبێ قورئانخوێندن و یادکردنی خودا و بێ دوعاو پاڕانەوە لە خوای گەورە عیبادەت نییە و شتێکیش نییە کە فەرمانی پێکرابێت، بەڵکو دەرگای وەسوەسە دەکاتەوە، بۆیە سەرقاڵبوون بە یادی خوای گەورەوە باشترە لە بێدەنگبوون.

ـ ئیماندارى ژیر و ئاقڵ گشت کاتەکانی بە فرسەت ئەزانێ بۆ یاد و زیکری الله تعالی، لە خۆشی و ناخۆشی و هەمیشە زیکر و یادی الله دەکات، کاتێ بە ڕێگا ڕێ دەگرێ بە دڵ و زمان زیکر دەکات، بیر و خەیالی بۆ بیرکردنەوە لە چۆنیەتی کردنی کاری چاکە و چاکەکاری و بۆ خوا ژیان و خزمەتکردنی ڕێبازی الله بەسەر دەبات، بۆیە گەر تەنها بووی مەهێلە شەیتان فێلت لێبکات و بیری خراپ و تووشی نەخۆشی دەروونیت بکات، هەمیشە بیر لەکردنی کاری چاکە بکەوە، چۆن خزمەتی ئیسلام بکەم، چۆن هاوکاری هەژارەکان بکەم، چۆن خەڵکی شارەزای ئیسلام بکەم، چۆن پەشیمان نەبمەوە لە قیامەت، یان دەتوانی قورئان

---

[1] - [الفتاوى_الكبرى : (٢/٢٩٨)]

بخوێنی لە دڵەوە، چەند لەبەرە بخوێینیتەوە، لە کـاتی چـوونە دەر، بـازار، سەفەرکردن، لە دڵەوە یاد وزیکر و قورئان بخوێنیـت، بـۆ ئەوەی کەمـردی پەشیمان نەبیو خۆزگە بە گەڕانەوە نەخوازی بۆ دونیا.

## سێزدەیەم:

شیخ الإسلام ابـن تیمـیە (ڕەحمەتـی اللـە تعـالی لێبێـت) دەفەرموێـت: (بحسب قلة علم الرجل یضله الشیطان)[1] واتە: بەگوێرەی کەمـی زانسـتی بەنی ئادەم، شەیتان هەڵی دەخەڵەتێنێت و گومڕای دەکات.

- مرۆڤ تەنها بە ئیسلام دەبێتە خاوەن عەقڵ و ژیری بەهێز کە وادەکـات دوور بێ لە کێشە و ناخۆشی فیتنەکان، بـۆیە کەسـی جاهیـل و نەزان بە ئیسلامی وادەکات شەیتان هەڵیبخەلەتێنێ و لە ڕێگـای گومـانگەڵێکەوە لە خشتەی ببات و سەرئەنجام سەرلێشێواوی بکات، بەڵام کەسی خـاوەن تەوحید و شارەزا بە ئیسلام نەک شەیتان بەڵکو مـرۆڤە زاڵـم سـتەمکارە دڵ ڕەقەکانیش ناتوانن گـومڕای بـکەن ئەگەرچـی بیکـوژن و گیـانی لە جەسـتەی جیـابکەنەوە، تەنـازوڵ ناکـات لە هەرچـی پلانـی و تەڵەکەی شەیتانی جن و مرۆڤە، کەسی ژێر هەوڵدەدا فێری زانستی شەرعی ببێـت، بۆیە یەک لە نواقسەکانی ئیسلام هەڵوەشێنەرەکان ئەوەیە مرۆڤ هەوڵـی فێربوونی دینەکەیان نادەن باخۆمان فێری ئیسلام بکەین بەو شێوەی اللـە پێی ڕازییە نەک فڵان شـێخ و فیسـار پـاکەی پێغەمـبەری ئـازیز ﷺ بە ڕاست و دروستی پێی گەیاندووینە تاکو شەیتان و نەوەکانی شـەیتان لە مرۆڤەکان نەتوانن زیانمان پێ بگەیەنێن و گومڕامان بکەن.

---

[1] - (الصارم المسلول، ص٤٠١)

## چواردەیەم:

شیخ الإسلام ابن تیمیه (ڕەحمەتی الله تعالی لێبێت) دەفەرمووێت:

(مَن رضِي عملَ قومٍ حُشر معهم، كما حُشرت امرأةُ لوطٍ معهم، ولم تكنْ تعملُ فاحشةَ اللواطِ!)[1] واتە: هەر کەسێك ڕازی بێت بە ئیشی هەر کەس و گەلێك ئەوە لەگەڵ ئەواندا حەشر دەکرێت، هەر وەکو چۆن خێزانی پێغەمبەر لوط (علیه السلام) لەگەڵ گەلی خۆیدا حەشردەکرێت، لەکاتێکدا خۆشی کاری نێربازی نەکردوە.

- بۆیە دەبێ ئەمڕۆ چەند کەسی بەناو موسوڵمان کە دڵی بەو یەك دوو نوێژ و ڕۆژوو و خێرکردنە خۆشە بەڵام بێ ئاگا لەوەی کە لەگەڵ عەلمانی و دیمۆکراسیەکاندا حەشر دەکرێت کە بەردەوام دژایەتی دینی اللە و پەیڕەوکارانی دەکەن لەکاتێدا خۆشی لەماڵی خۆی دانیشتوە بەڵام وردوو دروشتی کارە کوفریەکانی ئەوان بەشدارە و هاو سزایە؟!

(فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ)[2] واتە: ئێمەش لوت و خانەوادەکەیان ڕزگار کرد جگە لە هاوسەرەکەی چونکە ئەویش لەو کەسانە بوو کە تیاچوون و لەناومان بردن.

بزانە بەچی ڕازی و لەگەڵ کێی و کێت خۆشدەوێ و سەری دەخەیت.

[1] - مجموع الفتاوى (١٥/٣٤٤)

[2] - الاعراف ٨٣.

## پازدەیەم:

شیخ الإسلام ابن تیمیە (ڕەحمەتی الله تعالی لێبێت) دەفەرمووێت:

(لا یحصل الإخلاص إلا بعد الزهد، ولا زهد إلا بتقوی، والتقوی: متابعة الأمر والنهي)[1].

واتە: نیازپاکی دەستەبەر نابێ هەتا زوهد و دونیا نەویستی نەبێ، دونیا نەویستیش نابێ هەتا تەقوا و لەخوا ترسان نەبێ، تەقواش بریتیە لە: شوێنکەوتنی فەرمانی شەرع.

- واتە نیەتێکی پاک دروست نابێ لە هیچ شتێک تاوەکو زوهد و دونیا نەویست نەبین، بەتەنها لە ژیانی دونیا خەمت بەس خۆشی ڕابواردن و هەلاو و بەزم و تێکۆشانت بۆ دونیا نەبێ، بەڵکو ئامانجت با تەنها اللەبێ، زوهد و دونیا نەویستیش نابی تاوەکو تەقوا و لەخواترسانت نەبێت، وە تەقواش بریتیە لە گوێڕایەڵی قورئان و سوننەت و شوێنکەوتنی شەریعەت و یاسای ئیسلام گشت فەرمانێک کە لە ئیسلامەدا هاتبێت..

- زوهد: واتە کەسی دونیا نەویست.

[1] - [ الفتاوی ١/ ٩٤ ]

**شـازدەیەم:** شـیخ الإسـلام ابـن تیمـیە (ڕەحمەتـی اللـه تعـالی لێبێـت) دەفەرمووێت: (فإن طريق السنة: علم، وعدل، وهدى؛ وفي البدعة: جهـل، وظلم، وفيها اتباع الظن ومـا تهـوى الأنفـس)[1]. واتـە: ڕێـگەی سـوننەت: زانسـت و دادپەروەری و ڕێنمایـیە، بەڵام لە بیـدعەدا نەزانـی و سـتەم و شوێنکەوتنی گومان و ئارەزووی دەروونی تێدایە.

- بەڵێ ڕێگـای سـوننەت ڕێگـاکەی ڕوونـاکەو بـێ گـرێ و گـۆڵە، بەڵام پڕیەتی لە ئازار دڵ شکان خەم ماندووبوون و ئازار ڕووبەڕوو بوونەوەی قسەی ڕەق و بەڵام ڕێگـای بیـدعە ڕێگـای هەواو هەوس و حـزی مـرۆڤە جاهیلەکانە کە تەنازووڵ دەکەن لەو ئیسلامە پاکەی الله بۆ پێغەمـبەری ئازیزی ﷺ ناردووە، لە پێنـاو پـارەو مـاڵی دونیـایی، ئیمانـداری ژێـر ئەو کەسەیە سوننەتی ناسی دەستی پێوە دەگرێت، ناڵێـت بـۆچی و لەبەرچـی یەکسەر تەسلیمی دەبێت و ملکەچی فەرمانەکانی شەریعەت بێت.

وصلى الله على إمام المجاهدين محمد وعلى آله وصحبه والتابعين.



[1] - مجموع الفتاوى (١٠/٥٦٨)